بسم الله الرحمان الرحيم
والحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على
رسول الله محمد وعلى اله وصحبه اجمعين



ئەی خوشکەکەم ، ئەی ئەو
کەسەی کە خوای گەورە ڕێزی گرتویت و
لەهەموو دروستکراوەکانی بەڕێزتری
ئەی ئەو کەسەی کە خوای گەورە تۆی
بۆ بەهەشت دروست کردووە و دەیەوێ
تۆ لەناز و نیعمەتی بەهەشتدا
بحەسێیتەوە
خۆت مەخەڵەتێنە بەبیانوی هیچ و
کەم نرخ



مەهێڵە شەیتان لێت بباتەوە بەوەی
هەموو جارێك بۆ هەڵەکانت عوزر بۆ
خۆت بهێنیتەوە و فەتوای دروستێتی
بۆخۆت بدەیت
مەڵێ من گەنجم و تەمەنم زۆر ماوە
تۆزێك گەورەبم ئەوکات بڕیار ئەدەم
چونکە کاتی مردنی خۆمان نازانین بۆیە
تازوتر تەوبە بکەین هێشتا درەنگە









## خوشکەشیرینەکەم :







ئەم نوسینەی بەردەستت دیارییەکی
خوایە بۆ تۆی ناردووە چونکە خوای
گەورە یەکێکی خۆش بوێ ئاگاداری
ئەکاتەوە لەهەڵە و کەموکوڕییەکانی
بۆیە باش بزانە کە خوای گەورە
تۆی خۆشەوێ و ڕقی لێت نیە
وە بە تەوبەکردن و گەڕانەوەی تۆ
لەهەڵە و کەموکوڕی زۆر خوشحاڵ
دەبێت تەنانەت لەو دایکە خۆشحاڵترە
کەمناڵەکەی لێ ون بووە و
دەیدۆزێتەوە








## ئەی کچی ئیسلام :







شەیتانی دەرکراو لەڕەحمی خوا
دوژمنی سەرەکی من و تۆشە
دوژمنیش هەموو کاتێ پیلان دائەنێ
تاوەکو تۆ لەکەداربکات
یان تۆ بڕوخێنێت










شەیتان چونکە خۆی ناچێتە
بەهەشتەوە و شوێنی دۆزەخە
سوێندی خواردووە و بڕیاری داوە من و تۆ
و هەموو نەوەکانی ئادەم
هەڵخەڵەتێنێ تەنیا یەکێك
هەڵناخەڵەتێ کە بەچاکی و بەڕاستی
خوا بپەرستێ و هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا
دانەنێ و بڕیاری دابێ کە هەرچیەك لای
خواوە بێت جێبەجێی بکات و هەرچیش
خوای مەزن قەدەغەی کردبێ وازی لێ
ئەهێنی و نایکات

بۆیە ئەبێت باش بزانی کە شەیتان
دوژمنی سەرسەختی تۆیە
هیچ کات شەیتان نایەت دەستت بگرێت
بڵێ ئەبێ بەزۆر ئەم تاوانە بکەی
بەڵکو سەرەتا گومانت لەلا دروست
دەکات پاشان جوانی ئەکات
وەتەنها فێڵی شەیتان بۆ من و تۆش
گومان دروست کردن و بیانوی بێبەها
هێنانەوەیە











فێڵ و پیلانەکانی شەیتانیش
هێندە لاوازن کە هەموو کەسێکی ژیر و
دانا ئەتوانێ بەکەمترین بیرکردنەوە
لەناوی بەرێ
خوای گەورە لە قورئاندا لە سورەتی
النساء دا دەفەرموێت :

إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾

واتە : بێگومان پیلان و فێڵەکانی
شەیتان زۆر لاوازە



ئێستاش چەند بیانو و فێڵ و پیلانێکی
شەیتانەکان لە جنۆکە و ئینسانەکان
وەڵام دەدەینەوە بەپشتیوانی خوای
گەورە تاوەکو بەئاگا بێی لەخەوی
غەفڵەت و چیتر ئەو بێبەش لە ڕەحمی
خوایە نەتوانێ فریوت بدات



بیانوی یەکەم : جارێ من مناڵم و تەمەنم کەمە با گەورە بم ئەوکات حیجاب ئەکەم ئێستا کەس سەیری من ناکات .



وەڵام : قسەکەت زۆر تەواوە و لەجێی خۆیەتی کە تەمەنت کەمە و ئەتەوێ گەورە بیت بەڵام ئایا ئەتوانی گرەنتی مانەوەت بکەی بۆ چەند ڕۆژێك تەنانەت بۆ چەند چرکەیەکی تەمەنیشت بێگومان نەخێر وە هیچ کەسیش ناتوانێ وابڵێ چونکە ژیان و مردنمان تەنها لەژێر دەسەڵاتی خوای گەورەدایە بۆیە مادەم کاتی مردنت نازانی پێویستە واز لەم بیانوەت بهێنی

خوای گەورە لە قورئاندا لە سورەتی لقمان دا دەفەرموێت :

وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾

واتە : هیچ کەسێك نازانێت بەیانی چی بەسەردا دێت وە هیچ کەسیش نازانێت لە چی زەویەکدا دەمرێت و کۆتایی ژیانی لەکوێیە بەدڵنیایەوە هەر خوا ئەزانێت وە خوای گەورە زۆر زانایە و زانیارییەکی زۆر وردی هەیە وە هیچ شتێك لەخوای گەورە ناشاردرێتەوە .





بیانوی دووەم : هێشتا قەناعەتم بۆ دروست نەبووە حیجاب بکەم هەر شتێکیش بەقەناعەتەوە نەیکەی نەکردنی باشترە .

وەڵام : بەڕاستی قسەیەکی زۆر جوانت کرد دەم خۆش . ئێمەش هەوڵ ئەدەین قەناعەتت بۆ دروست بکەین سەبارەت بە باڵاپۆشی .
سەرەتا باش بزانە حیجاب یان خۆداپۆشین بۆ پاراستنی تۆیە ، بۆ پاك ڕاگرتن و نیشاندانی شەرم و حەیای تۆیە بەرامبەر خوا پاشان خەڵکی

بیرت لەوە نەکردۆتەوە کە ئەو میوەیەی ڕۆژانە ئەیخۆیت هەموی توێکڵێکی پارێزەری پێوەیە تاوەکو ناوەوەی بپارێزێ لەمیکرۆب و ڤایرۆس





بیانوی دووەم : هێشتا قەناعەتم بۆ دروست نەبووە
حیجاب بکەم هەر شتێکیش بەقەناعەتەوە نەیکەی
نەکردنی باشترە .

تەنانەت زەوی بەو گەورەییەوە خوای مەزن چەند چینێك
پەردەی لەدەور داوە ئەگەر بێت و تەنها یەکێك لەو چینانە
کون بێت ئەوا سەرتاپای زیندەوەران و مرۆڤەکان
بەو ژەهر و ماددانە ئەمرن

خۆ ئەگەر بێت و خۆشت بچیتە بازاڕ بۆ ئەوەی شتێك بکڕیت
هەوڵ ئەدەی کام شتە پاك و خاوێنە لەکەسێکی پاك و
خاوێن بکڕی مەگەر تۆ کەسێکی خۆویستی؟
نەخێر
بەڵکو خەمی تەندروستی خۆتە








بیانوی دووەم : هێشتا قەناعەتم بۆ دروست نەبووە حیجاب بکەم هەر شتێکیش بەقەناعەتەوە نەیکەی نەکردنی باشترە .

یان ئەگەر دایکت یان باوکت کەچەند خۆشەویستن لەلات شیرینیەکت بۆ بێنن کەببینی ڕەنگی جوان نیە یان کەڕوی کردبێ ئەیخۆی ؟ نەخێر مەگەر بتەوێ خۆت بەرەو نەخۆشی و نەخۆشخانە بەریت .

یان کاتێك کەباران ئەبارێت بۆ ئەوەی تەڕ نەبی چی ئەکەیت ؟
ئەگەر جلێکی باش لەبەرنەکەی ئەبێت چەترێ بگری بەدەستەوە ئەگەرنا هەموو گیانت تەڕ ئەبێ و بۆی هەیە نەخۆش بکەوی





بیانوی دووەم : هێشتا قەناعەتم بۆ دروست نەبووە حیجاب بکەم هەر شتێکیش بەقەناعەتەوە نەیکەی نەکردنی باشترە .

یان هیچ کات زەرەنگەرێکت بینیوە زێر و خشڵەکانی لەسەرشەقام بفرۆشێت بێگومان نەخێر چونکە ئەڵێ ئەم ئاڵتونانەی من زۆر بەنرخن ئەبێ لەشوێنێکی زۆر پارێزراودا بێت تەنانەت زۆربەیان هەموو شەوێك کە ئەڕۆنەوە لەگەڵ خۆیان ئەیبەنەوە ماڵەوە و لە خەزێنەیەکی زۆر باش و تۆکمەیا هەڵی ئەگرن .

ئایە ئەم زەرەنگەرە خشڵەکانی خۆی خۆش ئەوێ یان ڕقی لێیەتی کەوا پارێزگاری لە ئاڵتون و خشڵەکانی ئەکات ؟ بەدڵنیایەوە زۆری خۆش دەوێت و بەلەدەست چونی یان کەمترین پەڵەشی لەسەر بێت لەوەیە زۆر بێتاقەت و خەمبار بێت





بیانوی دووەم : هێشتا قەناعەتم بۆ دروست نەبووە حیجاب بکەم هەر شتێکیش بەقەناعەتەوە نەیکەی نەکردنی باشترە .

ئەم نمونە بچوکانە هەمویان زۆر نزیکن لێتەوە وە بیرت دەخەنەوە کە ئەم شتانە هیچیان لەتۆ بەڕێزتر و خۆشەویستتر و چاكتر و شیرین تر نیە لای خوا کەچی هەمووشیان ئاوا ئەپارێزرێن .

ئەی تۆی گەوهەر ئاسا ، تۆی نیوەی کۆمەڵگا و دایك و خوشکی نیوەکەی تریش ، تۆی خۆشەویستی خوا ، تۆی شایستە بەهەموو شتێکی باش

پێویست ناکات خۆت داپۆشیت ؟ خۆت بپارێزت لە چاوی پیاوێك کە ناتوانێت بەحەڵاڵی لێت نزیك بێتەوە ، تەنها چاوە برسیەکانی بە جەستەی تۆ تێر بکات

لەهەمان کاتدا خۆشت و ئەویش گوناهبار بکەیت ؟

بەڵێ بێ هیچ دوودڵییەك تۆش شایستەی بەوەی کەوا پارێزراو بی و خۆت داپۆشی

تۆ لەدنیادا تەنیا بۆ یەك پیاوئەبی ئیتر بۆ خۆت بۆ ئەو هەموو پیاوە نمایش دەکەی ؟؟؟






## بیانوی سێیەم : نەمبیستووە خوا فەرمانی کردبێ
## کە لەچك بکەین یان خۆمان داپۆشین



وەڵام : لەوەیە بەڕێزت نەتبیستبێ یاخود نەتخوێند بێتەوە یان بەهەڵە تێیان گەیاندووی

فەرموو بابەیەکەوە بچینە خزمەت قورئانی پیرۆز و لەئایەتەکان تێڕابمێنین

سەیری کە خوای گەورە لە قورئاندا لە سورەتی الأحزاب لەئایەتی ٥٩ ئەفەرموێ :

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە خێزانەکانت و کچەکانت و خێزانی باوەڕداران بڵێ با جلباب و لەچك و پۆشاکەکانیان شۆڕ بکەنەوە تا هەموو لەشیان بگرێتەوە و جوانی خۆیان دەرنەخەن و سینگ و ملیان داپپۆشن ئەمە نزیکترە لەوەی کە بناسرێنەوە تاوەکو ئازار نەدرێن لەلایەن خەڵکیەوە ،

لەبەر ئەوەی کاتی خۆی ئەوەی ئافرەتی ئازاد بوایە بەو شێوازە خۆی دائەپۆشی ، وە ئەوەی کەنیزەك و داوێن پیس بوایە خۆی دانەئەپۆشی بۆیە ئەیانزانی کەئەمە ئافرەتی ئازادە و لەلایەن کەسانی خراپەوە ئازار نەئەدران وە خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو بەبەزەییە .



بیانوی سێیەم : نەمبیستووە خوا فەرمانی کردبێ کە لەچك بکەین یان خۆمان داپۆشین

ڕابمێنە لەسورەتی النور دا لەئایەتی 31دا هاتووە
کە خوای مەزن دەفەرموێ :

وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا

واتە : ئافرەتانی موسوڵمانان با جوانی خۆیان دەرنەخەن بێجگە لەو ئەندازەی وا دیارە وەکو دەم وچاوو دەستیان تامەچەکیان وگۆشەی لەچکەکانیان بدەن بەسەر سنگیاندا تا گەردن و سنگیان داپۆشرێ وەجوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ مێردەکانیان

= = = = = = = = = = = = = = = = = = = = =

ئەگەر سەیری ئایەتەکان بکەیت و بیری لێ بکەیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە خوای گەورە بەئاشکرا و بەڕاستەوخۆیی فەرمانت پێ دەکات کە خۆت داپۆشیت بەڵکو قەدەغەی ئەوەت لیدەکات کە خۆت دەرخەی وەکو قەومەکانی پێش ئیسلام



## بیانوی سێیەم : نەمبیستووە خوا فەرمانی کردبێ کە لەچك بکەین یان خۆمان داپۆشین

سەیری ئایەتی 33 بکە لە سورەتی الأحزاب :

وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ

واتە : وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی پێشوو جوانی خۆتان بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرمەخەن،
کەواتە سفوری و خۆدانەپۆشین و دەرخستنی جوانی پێشکەوتن نیە بەڵکو پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی بووە لەپێش ئیسلامدا

ئایا ئەم ئایەتانە بەڵگە نین بۆ فەرزبوونی حیجاب و باڵاپۆشی ؟ بێگومان ئەگەر فێڵ لەخۆمان نەکەین بەڵگەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کەسی ژیریش یەك بەڵگەی بەسە بەڵام یەکێك دوای نەفس و هەوا و ئارەزوو بکەوێ هەزاران بەڵگەش باوەڕی پێناکات.



بیانوی چوارەم : من باوەڕم پێیەتی بەڵام دایك و باوكم یان هاوسەرم ڕێگەم پێنادەن .

وەڵام : زۆر ڕاستە هەندێ جار دایك و باوك یان برا ڕێگری دەكەن لەوەی تۆ خۆت داپۆشیت بەڵام لەوانەیە ئەوان وەكو سەرەتای تۆ نەیزانن وە پێویست دەكات كە بۆیان ڕوون بكەیتەوە بەڵام هەوڵ بدە بەشێوەیەكی زۆر جوان قسەیان لەگەڵدا بكە وە هەوڵ بدە فەرمایشتی خوایان بۆ بخوێنەوە ، ئەگەر هەر سووربوون لەسەر ئەوەی تۆ خۆت دانەپۆشی بەگوێیان مەكە چونكە فەرمانی خوا شایستەتر و لە پێشترە كە جێبەجێ بكرێت وەك لەفەرمانی ئەوان

خوای گەورە لە سورەتی لقمان لە ئایەتی 15دەفەرموێ :

وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ

واتە : ئەگەر دایك و باوكت هەوڵ و كۆششیان لەگەڵدا دایت بۆ ئەوەی كە شەریك بۆ من دابنێی لە كاتێكدا تۆ هیچ زانست و زانیاریەكت نیە كەخوای گەورە شەریكی هەبێ ئەوە تۆ لەو شتەدا بە قسەیان مەكە و گوێڕایەڵییان مەكە بەڵام لەدونیادا چاكە كاربە لەگەڵیاندا ئەگەر موشریكیش بوون تۆ هەر لەگەڵیاندا چاكە بكە تەنها بەقسەیان مەكە

## بیانوی چوارەم : من باوەڕم پێیەتی بەڵام دایك و باوكم یان هاوسەرم ڕێگەم پێنادەن .

سەعدی كوڕی مالیك دەفەرموێت : ئەم ئایەتە لەسەر من دابەزیوە كە زۆر چاكە كار بووم لەگەڵ دایكم ، كە موسڵمان بووم ، وتی ئەی سەعد ئەم دینە تازەیە چییە ؟ یان دەبێت واز لەدینەكەت بێنیت یان من خواردن و خواردنەوە ناخۆم تا لەبرس و تینوێتیدا دەمرم و ئەو كاتەیش خەڵكی گاڵتەت پێدەكەن و دەڵێن: ئەی بكوژی دایكت ، منیش وتم ئەی دایكە وامەكە من لەبەر هیچ شتێك واز لە دینەكەم ناهێنم ، شەو و ڕۆژێك هیچی نەخوارد و ماندوو بوو ، شەو و رۆژێكی تریش هیچی نەخوارد زیاتر ماندوو بوو ، وتم: ئەی دایكە سوێند بەخوای گەورە ئەگەر سەد گیانت هەبێت و یەك لەدوای یەك دەرچێت من واز لەدینەكەم ناهێنم ، ئیتر ئارەزوی خۆتە دەخۆیت یان نا ، ئەویش دەستی كردەوە بە خواردن و خواردنەوە

وە پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی :

لاطاعة لمخلوق في معصية الله. اخرجه احمد

واتە : گوێڕایەڵی بۆ بەندە ناكرێت ئەگەر سەرپێچی خوای تیا بكرێ



**بیانوی چوارەم : من باوەڕم پێیەتی بەڵام دایك و باوكم یان هاوسەرم ڕێگەم پێنادەن .**

**تۆش وەكو ئەو هاوەڵە خۆشەویستە ئەگەر دایكت یان**
**باوكت فەرمانی بەتاوان پێ كردی بەگوێی مەكە و**
**فەرمانی خوا و پەیامبەری خوا صلی الله علیه وسلم**
**جێ بەجێ بكە نەك فەرمانی ئەوان**
**ئەگەر ئەوان بزانن تۆ بڕیاری خۆت داوە وازت لێدەهێنن**
**بۆیە سوربە لەسەر ئەوەی كە ئەو بڕیارە دروستەت دا**
**لێی پەشیمان نەبیتەوە و داوای كۆمەكی و یارمەتی**
**لەخوا داوا بكە زۆر دڵنیابە خوا پشتت بەرنادا**
**بەڵكو هەمیشە و هەموو كاتێ پشتگیری و**
**پاڵپشتی لە خۆشەویستانی خۆی دەكات**



## بیانوی پێنجەم : ئەگەر بێت و حیجاب بم و خۆم داپۆشم خەڵکی گاڵتەم پێدەکەن

وەڵام : زۆر ڕاستە کەسانی دڵ نەخۆش هەمیشە گاڵتە بەکەسی باش ئەکات بەڵام ئەبێ تۆ وەك پۆڵا وابی لەبەهێزییا وە قسەی ئەوانەی گاڵتەت و سوکایەتیت پیدەکەن کارت لێنەکات و قسەکانیان بخەرە ژێر پێت دڵنیابە پێی بەرز ئەبیتەوە
پاشان پێویست ناکات دڵگران بیت لەوەی گاڵتەت پێدەکەن پەیامبەرەکەت دروودی خوای لەسەربێت لەلایەن نەیار و دوژمنانیەوە زۆرترین سوکایەتی پیکرا وە زۆرترین ئازار درا لەکاتێکا ئەو خۆشەویستی خوا بوو خۆ ئێمە لەو زیاتر نین قەیچێکە باتۆزێك گاڵتەشمان پێ بکەن دڵنیابە ئەو قسانەی ئەوان هەموی پلەی تۆ لای پەروەردگار بەرزئەکاتەوە ئەوانیش ئەگەر تەوبە نەکەن بەئاگر سزایان ئەدا .



## بیانوی پێنجەم : ئەگەر بێت و حیجاب بم و خۆم داپۆشم خەڵکی گاڵتەم پێدەکەن

سەیری فەرمایشتی خوا بکە لە باسی ئەو کەسانەی کەخۆشی دەوێت وەسفیان ئەکات بەم شێوەیە

لە سورەتی المائدە ئایەتی 54:

وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ

واتە : خۆشەویستانی خوا لەلۆمەی لۆمەکاران ناترسن

تۆش ئەگەر پێت خۆشە ببیتە خۆشەویستی خوا ئەو سیفەتە لەخۆتا بەرجەستە بکە

پاشان خەڵك لەخوای مەزن ڕازی نین و قسەی پێدەڵێن بەتەمای لەتۆ ڕازی بن ؟





## بیانوی شەشەم : ناتوانم باڵاپۆشی بکەم چونکە زۆر گەرمە هەرئەسوتێم لەناویا

وەڵام : خوشکە باشەکەم ڕاستە گەرمە لەسەرتاوە لەسەرت قورسە بەڵام هەر یەکەم جار و دووەم جارت زەحمەتە دواتر ڕادێی لەگەڵیا بگرە واشت لێدێ ئەگەر بۆ شوێنێك بڕۆی جلەکانت بەتەواوی گیانت دانەپۆشیت واهەستەکەی شتێکت ون کردووە

لەهەمان کاتدا گەرمای ئەم دنیایە ئەڕوات و ئەبڕێتەوە وە لەبیریش ئەچێتەوە

بەڵام گەرمای ئاگری دۆزەخ زۆر زۆرە و کەس بەرگەی ناگرێت و هیچ کەسیش ناتوانێ لەبیری بەرێتەوە

سەیری سورەتی التوبە بکە ئایەتی 81:

قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّاۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾

واتە : ئەی محمد صلی الله علیه وسلم پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە لەم گەرمای هاوینە ئەگەر ئێوە تێئەگە ن، کە ئارام نەگرن لەسەر ئەم گەرماییەی دونیا چۆن ئارام ئەگرن لەسەر ئاگری دۆزەخ



ئاگری دۆزەخ گەرمترە



## بیانوی شەشەم : ناتوانم باڵاپۆشی بکەم چونکە زۆر گەرمە هەرئەسوتێم لەناویا



پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت:
ئاگری دونیا بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ ، وەدەفەرموێ : ئەگەر ئەم مزگەوتە سەد هەزار کەس یان زیاتری تیا بێت، تەنها پیاوێکی دۆزەخی تیا بێت و هەناسەیەك بدات بەو هەناسەیە مزگەوتەکە و ئەوەی تیایەتی هەمووی دەسوتێت وەدەفەرموێ : سوکترین سزای دۆزەخ بۆ کەسێکە کەجوتێك نەعلی ئاگرینی لەپێیە دەماغی پێوەی دەکوڵێت، وا ئەزانێت سزای کەس وەك ئەم سەخت نیە لە راستیشدا ئەو سزای لەهەموو دۆزەخیەکان سوکترە .
بۆیە تۆی ژیر و تێگەیشتوو گەرمای ئەم دنیایە هەڵدەبژێری چونکە ئەزانی گەرمای ئاگری دۆزەخ زۆر زیاترە وەسەیری چواردەوری خۆت بکە هەرلەسەردەمی پەیامبەری خواوە صلی الله علیه وسلم کچان و ئافرەتانی موسوڵمان خۆیان داپۆشیوە و هیچ کێشەی گەرمیان نەبووە و خۆیان لەگەڵی ڕاهێناوە مادەم ئەوان بتوانن و کردویانە وەتۆش وەکو ئەوان دەتوانی بیکەی چونکە هیچت لەوان کەمتر نیە بەڵکو لەوەیە زیاتر لەوانت هەبێ.



## بیانوی شەشەم : ناتوانم باڵاپۆشی بکەم چونکە زۆر گەرمە هەرئەسوتێم لەناویا

ئەگەر بێت و خۆشت دەربخەی و باڵاپۆشی نەکەی خۆت شایستەی سزا و توڕەیی خوا دەخەی کە ئەمەش کارەساتێکی گەورەیە خوای گەورە بتپارێزێت لێی سەیری فەرمایشتی پەیامبەری خوا صلى الله عليه وسلم بکە کە لەبارەی ئافرەتانی سفوور چی دەفەرموێت

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:

صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا... وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلَا يَجِدْنَ رِيحَهَا وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا ...... **رواه مسلم**

واتە: دوو کۆمەڵ هەن لە ئەهلی دۆزەخ نەمبینیوون... کۆمەڵێکیان ئافرەتانێکن داپۆشراون بەناو لە ڕاستیدا ڕووتن ، بەلەنجەولار بەڕێگادا دەڕۆن ، و سەرنجی پیاوان بۆ خۆیان ڕادەکێشن ، و پرچیان بە شێوەیەك بەسەر سەریانەوە دەبەستن وەکو سەر پشتی ووشتر وایە، ئەو جۆرە ئافرەتانە ناڕۆنە بەهەشتەوە ئەگەر چی بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندە و ئەوەندەشەوە دەکرێت

خوشکە شیرینەکەم خۆت لەم سزایە دوورخەرەوە بە جێ بەجێ کردنی فەرمانی خالیقەکەت



بیانوی حەوتەم : ئەترسم حیجاب بکەم و دواتر لاییەم
چونکە خەڵکم بینیوە وابوون

وەڵام : هەقی خۆتە بترسی بەڵام مادەم تۆ باوەڕت هەیە بەوەی حیجاب فەرزە و بەنەکردنی گوناحبار ئەبی دڵنیابە لەوەی خوای دلۆڤان کۆمەکیت ئەکات
شێخ ابن باز رحمه الله پرسیاری لێئەکەن فڵان کەس لەدین وەرگەڕا یان وازی لەدین هێناوە ؟
ئەویش دەفەرمێ : بەهۆی دوو شتەوە بووە
یەکەم : سوپاسی خوای نەکردووە لەسەر ئەو نیعمەتی هیدایەتە
دووەم : داوای جێگیری و بەردەوامی لەخوا داوا نەکردووە .
پەیامبەری خۆشەویست صلی الله علیه وسلم
زۆربەی کات ئەم نزایەی کردووە

يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ . الترمذي ٣٥٥٢

واتە : ئەی ڕاگری دڵەکان دڵم لەسەر
دینەکەت جێگیر بکە
ئەگەر خۆشەویستی خوا ئەم نزایە بکات ئەوا ئێمە
لە پێشترین کە بیکەین



بیانوی حەوتەم : ئەترسم حیجاب بکەم و دواتر لایبەم چونکە خەڵکم بینیوە وابوون

دڵنیابە خوا نائومێدت ناکات و هیدایەتت ئەدات وە بەردەوامیشت ئەکات لەسەر حیجاب و دینداری

وە زۆر ئاگاداری هاورێکانت بە هەوڵبدە هاورێکانت با کەسانی باش بن ، باکەسانێك بن خۆیان باڵاپۆش بن و باڵاپۆشیت لا شیرین بکەن نەك کەسانێك بن گاڵتەت پێ بکەن و لات ناشرین بکەن

هاوەڵی خۆشەویست ابن مسعود خوا لێی ڕازی بێت باسی کەسی ئیماندار و کەسی خراپەکار دەکات و دەڵێ :

إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَأَنَهُ قَاعِدٌ تَحْتَ جَبَلٍ يَخَافُ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ، وَإِنَّ الفَاجِرَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ مَرَّ عَلَى أَنْفِهِ. رواه البخاري

واتە : کەسی ئیماندار تاوانەکانی وەکو شاخێك دەبینێت کە ترسی ئەوەی هەیە بکەوێ بەسەریا ، وەکەسی خراپەکار واسەیری تاوانەکانی ئەکات کە مێشولەیەك لەسەر لوتی بێ لای بدات

واتە تاوانەکانی لەلا کەم نرخە و واهەست ئەکات کە تاوانەکەی شایەنی باسکردن نیە

بیانوی حەوتەم : ئەترسم حیجاب بکەم و دواتر لایبەم
چونکە خەڵکم بینیوە وابوون



بۆیە بە بچوکی سەیری تاوانەکانت مەکە چونکە تاوانی حیجاب نەکردن هێندە کەم نیە کە لەبیری بکەی بیر لەوە بکەرەوە ئەگەر حیجاب نەکەی :

یەکەم : فەرمانی خوات شکاندووە

دووەم : خۆت دوورخستۆتەوە لە ڕێگەی هیدایەت دراوان بەهۆی تاوانی خۆتەوە

سێیەم : بەلای پیاوێکا بڕۆی و سەیرت بکات بە گوناح و تاوان لەسەر تۆ و ئەویش ئەنوسرێ

چوارەم : نزیك ئەبیتەوە لەکەسانی خراپ و خراپەکاران کەئەگەری توشبوون بە هەڵە و تاوان زۆر زیاتر ئەبێ

وەزۆر شتی تریش هەیە کەلەوەیە بەبیرکردنەوە لێی زیاتر بدۆزیتەوە



## بیانوی هەشتەم : ئەگەر باڵپۆش بم کاتی زەواج کردنم دوادەکەوێ بۆیە دوای زەواج حیجاب ئەکەم

وەڵام : لەمەیانا بەهەڵەیا چووی چونکە زۆربەی ئەو ئافرەتانەی کەزوو شوودەکەن و ئەچنە ژیانی هاوسەرگیرییەوە ئەوانەن کە زۆر داپۆشراون چونکە پیاوانی ئەمڕۆ سیقەیان بەهەموو ئافرەتێك نیە وە زۆربەی کات ئەو کەسانەی کە خۆیان داناپۆشن قسەی باش ناکەن لەبارەیانەوە

یەکێك لەو قسانە ئەوەیە ئەڵێن : ئەم ئافرەتە ئەگەر گوێڕایەڵی خوا نەکات کە فەرمانی پێکردووە خۆی داپۆشێ چۆن بەقسەی من دەکات ئەگەر بیکەمە هاوسەری خۆم کەئەمەش تاڕادەیەکی زۆر ڕاستە .

پاشان ئەگەر پیاوێك تۆی بوێ ئەبێ بەو شێوەیە تۆی بوێ کەهەی نەك خۆت بگۆڕی لەبەر ئەو بەتایبەت لەشتی حەرامدا

وە ئەگەر هاوسەرێك تۆی بوێت لەبەرئەوەی لای جوانی دڵنیابە ڕۆژێکی تر یەکێك ببینێ لەتۆ جوانتر بێت واز لەتۆ دێنێ بۆ ئەو بۆیە بەو قسانە مەخەڵەتێ

ئەبێت پیاوێك هەڵبژێریت و قەبوڵی بکەیت کە یارمەتیت بدات بۆ ڕێگای خوا ، بۆ ڕێگای بەهەشت و دەربازبوون لە ئاگری دۆزەخ

بیانوی هەشتەم : ئەگەر باڵاپۆش بم کاتی زەواج کردنم دوادەکەوێ بۆیە دوای زەواج حیجاب ئەکەم



وە دڵنیابە ئەگەر هاوڕێ و خوشکەکانی تۆ بتوانن بوحیجاب و عابا و زۆرجار بەنیقابەوە بچنە ناو ژیانی هاوسەرگیری ئەوا تۆش دەتوانی و مەگەر خوای گەورە قەڵەمی لێنەدابێ

پاشان بزانە استغفرالله داوای لێخۆشبوون کردن لەتاوان هۆکارە بۆ کردنەوەی دەرگا داخراوەکان ، هۆکارە بۆ ئەوەی ڕزقی زەوی و ئاسمان بەسەرتا بباریێت ، هۆکارە بۆ ئەوەی خوا بتخاتە بەهەشتەوە
سەیری ئەم ئایەتانە بکە لەسورەتی نوح :

فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾

پەیامبەر نوح علیه السلام بەخەڵکی وت : پێم وتن ئێوە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن لەو کوفرو تاوان و شیرکانەی کەپێشتر کردووتانە ئەبینن خوای گەورە زۆر لێخۆشبووە بۆ ئەو تاوانبارانەی کەداوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەن و لێیان خۆش ئەبێ

بیانوی هەشتەم : ئەگەر باڵاپۆش بم کاتی زەواج کردنم دوادەکەوێ بۆیە دوای زەواج حیجاب ئەکەم

يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾

وە خوای گەورە بارانتان بۆ ئەبارێنێ بارانێکی زۆر یەك لەدوای یەك بەلێزمە و بەخوڕ.

وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾

وە هەر بەهۆی أستغفر الله و داوای لێخۆشبوون کردن لەخوای گەورە ، خوای مەزن ماڵ و منداڵتان پێ ئەبەخشێ وەباخ و بێستانتان پێ ئەبەخشێ وە ئاو و کانی و ڕووباریشتان پێ ئەبەخشێ ، هەموو نیعمەت و بەخششێکتان پێ ئەبەخشێ تەنها ئێوە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن،

أستغفر الله و داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە هۆکارە بۆ هەموو ئەو نیعمەتانە کە خوای گەورە لە مرۆڤی گرتۆتەوە بەهۆی تاوانەکانیانەوە وەبە داوای لێخۆشبوون کردن دووبارە پێیان دەبەخشێتەوە

بیانوی هەشتەم : ئەگەر باڵاپۆش بم کاتی زەواج کردنم دوادەکەوێ بۆیە دوای زەواج حیجاب ئەکەم



بۆیە تۆش ئەگەر حەزدەکەی زوو شوو بکەی هیچ عەیب نیە بەڵام لەبری ئەوەی خۆت دەرخەیت و خەڵك نەزەرت لێ بکەن تۆ استغفراللّٰە زۆربکە و داوا لەخوا بکە بۆت ئاسان بکات

بێگومان بە لەوەی بە خۆ دەرخستن و حیجاب نەکردنت کاتی زەواجت پێش ناخەی چونکە کاتی زەواج و هەموو شتەکانی ژیانت بەدەست خوای گەورەیە بۆیە داوای لێبکە بەئومێدەوە و چاوەڕوان بکە هەتا خوا دەرگای بەختەوەری و خۆشیت لێدەکاتەوە

أستغفر الله

بیانوی نۆیەم : ڕاستە تاوانبارم و حیجاب ناکەم بەڵام خوا غفور و رحیمە لەتاوان هەرخۆش ئەبێ

وەڵام : زۆر ڕاستە خوای گەورە غفور و رحیمە
واتە خوا زۆر لێخۆشبوو و میهرەبانە
بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانین خوا شدید العقاب یشە واتە خوا سزاکەشی زۆر سەختە بۆ کەسی خراپەکار هەروەکو لە سورەتی المائدە ئایەتی ٩٨ ئەفەرموێ :

اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ وَأَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾

واتە : بزانن کەسزای خوای گەورە زۆر سەختە بۆ ئەو کەسەی کە سنووری خوا ئەبەزێنێ
ئەوەیشی کە تەوبە دەکات خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و بەبەزەیی و میهرەبانە
پاشان قسەکەت زۆر تەواوە خوا بەڕەحم و میهرەبانە بەڵام ئەگەر تەوبە بکەی و بگەڕێیتەوە بۆ لای
ئایا ئەزانی ئەگەر بگەڕێیتەوە چی مژدەیەکت بۆ هەیە سەیری ئایەتی ٧٠ بکە لە سورەتی الفرقان
خوای گەورە لەباسی کەسی تاوانکاردا دەفەرموێ :

إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾

بيانوى نۆيەم : راستە تاوانبارم و حيجاب ناكەم بەڵام خوا غفور و رحيمە ە لەتاوان هەرخۆش ئەبێ



واتە : ئەو كەسانەى تاوان زۆر ئەكەن و شايستەن بە سزاى سەختى قيامەت تەنها كەسانێك ئەگەر تەوبەيان كردبێ لەتاوانەكانيان وە ئيمانيان هێنابێ وە كردەوەى چاكيان كردبێ (كردەوەى چاك ئەوەيە نيەتت بۆ خوا بێت و بۆ ڕيا نەبێت ، وە لەسەر سوننەت بێت و بيدعە نەبێت) ئەمانە خواى گەورە لە دونيادا خراپەكانيان بۆ ئەگۆڕێت بە چاكە ، ياخود لە قيامەتدا خراپەكانيان بۆ ئەگۆڕێت بە چاكە وە خواى گەورە زۆر لێخۆشبوو و بەبەزەييە .

بينيت خوا چەند بەخشندەيە لەگەڵتا ئەگەر تەوبە بكەى و بگەڕێيتەوە لەتاوان ، خواى دلۆڤان نەك هەر لێت خۆش ئەبێت بەڵكو ئەو تاوانانەى كە ئەنجاميشت داوە هەموويت بۆ ئەكات بەچاكە و ئەيخاتە سەر تەرازووى كردەوە چاكەكانت .

توخوا چى كەسێك ئەوەت لەگەڵ ئەكات جگە لە زاتى پيرۆزى الله ؟



بیانوی نۆیەم : راستە تاوانبارم و حیجاب ناکەم بەڵام خوا غفور و رحیم ە لەتاوان هەرخۆش ئەبێ



بۆیە هەوڵ بدە خۆت لەو مژدە خۆشەی خوای گەورە بێبەش مەکە و بەدەستی بهێنە ئەگەر تائێستا تەوبەت نەکردووە بائێستا کاتی تەوبەکردنی تۆ بێت
هەڵمەستە هەتا تەوبە نەکەی و خۆت نەخەیتە بەر ڕەحمەتی خوای بەخشندە

وە دڵنیابە ئەگەر ئیماندار بیت چەندێك تاوانیشت هەبێت خوا لێت خۆش ئەبێ بەڵام ئەوەش بزانە ئەهلی سزادراوی ناو دۆزەخ کە ئەچنە بەهەشتەوە دوای سزادانیان بەدەموچاویانا دیارە کەئەم کەسانە لە دۆزەخدا سزا دراون

بۆچی خۆت ئەخەیتە بەر سزای خوا ؟ چی سودێك ئەکەی ؟
بەچی ئەگەی ئەگەر لەخوا دوور بی ؟
یەقینت هەبێ لە دووری بەخوا بەشتێك بگەی لەنزیکیت لەخوا ئاسانتر پێی ئەگەی





بیانوی دەیەم : تازە هەتا ئێستا حیجابم نەکردووە تازە لەڕووم نایەت خوا زۆر لێم توڕەیە هەر لێم خۆش نابێت ئەوەندە تاوانبارم



وەڵام : خوشکەکەم هیچ کاتێك درەنگ نیە بۆ تەوبە کردن وە هەموو کەسیش بەشی خۆی هەر تاوان دەکات ئەمەش مانای ئەوە نیە کە بەردەوام بین لەتاوان بەڵکو هەر کات توشی هەر تاوانێك بوین ئەبێ بەزوویی بگەڕێینەوە بۆ لای خوا سەیری میهرەبانی خوا بکە لە سورەتی الزمر ئایەتی 53:

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾

واتە: ئەی محمد صلی اللہ علیه وسلم بڵێ بەو بەندانەی کە زیادڕەویان کردووە لە تاوان و سەرپێچی خوادا بێ ئومێد و مەئیووس نەبن لە ڕەحم و بەزەیی خوای پەروەردگار ، چونکە خوای پەروەردگار لە هەموو تاوانێك خۆش دەبێت ، بەمەرجێك تەوبەی لێبکەی
وە بەدڵنیاییەوە خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و بەڕەحم و بەبەزەییە.





بیانوی دەیەم : تازە هەتا ئێستا حیجابم نەکردووە تازە لەڕووم نایەت خوا زۆر لێم تورەیە هەر لێم خۆش نابێت ئەوەندە تاوانبارم



ڕابمێنە لە وتەی خوای گەورە کە گلەیی لە بەندەکانی دەکات لە سورەتی الحدید ئایەتی 16دا دەفەرموێ :

﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ﴾

واتە : ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە باوەڕداران دڵیان نەرم بێ لە کاتی زیکری خوای گەورە و بیستنی قورئان و خوێندنەوەی، وە لەو حەقەی کە قورئانە و بۆیان دابەزیوە تا ملکەچ و گوێڕایەڵ بن بۆی ، (ابن مسعود) خوا لێی ڕازی بێت دە فەرموێ : (تەنها چوار ساڵ بوو موسڵمان ببوین خوای گەورە بەم ئایەتە گلەیی لێکردین )

سەیری بکە خوای گەورە گلەییمان لێدەکات هەتا کەی فەرمانەکانی خوا قبوڵ نەکەین ؟ ئەبێ کەی بێ کە بگەڕێینەوە بۆ لای خوای گەورە ؟
ئەبێ کەی بێ ڕەزامەندی خوا بەدەست بهێنین ؟؟؟
تا ئێستا کاتی نەهاتووە ؟ تائێستا بڕیارت نەداوە ؟



بیانوی دەیەم : تازە هەتا ئێستا حیجابم نەکردووە تازە لەڕوم نایەت خوا زۆر لێم تورەیە هەر لێم خۆش نابێت ئەوەندە تاوانبارم



بەڵێ خوشکەکەم ئێستا کاتێتی

با ئەم چرکەساتەی ئەم نوسراوە دەخوێنیتەوە خاڵی وەرچەرخانی تۆ بێت

باخاڵی گۆڕانی تۆ بێت لە خراپەوە بۆ باش

لە باشەوە بۆ باشتر

مادام خوای گەورە لە هەموو تاوانێك خۆش ببێت کەتەوبەی لێبکەین چیتر با شەیتان فریومان نەدات بەوەی کە لێمان خۆش نابێت

شەیتان چەندە ستەمکار و خراپەکارە داوای لەخوا کرد وەڵامی دایەوە ئێستا چۆن وەڵامی تۆ ناداتەوە کە باوەڕت پێیەتی و نوێژی بۆ دەکەیت و لێی دەپاڕێیتەوە و بەتەنها ئەیپەرستی و هاوەڵ و هاوبەشی بۆ بڕیار نادەی . چۆن وەڵامت ناداتەوە ؟

بێگومان وەڵامت ئەداتەوە

پاشان پەیامبەری خوا صلی اللّٰه علیه وسلم ئەفەرموێت :

کەسێکی تەوبەکردوو لەتاوان وەکو ئەوە وایە کە تاوانەکەی نەکردبێ .... **صحیح الجامع** ٣٠٠٨

داواکارم لەخوای گەورە هیدایەتت بدات بۆ سەر ڕێگای ئیسلام ، هیدایەتت بدات بۆ خۆداپۆشین و حیجاب و سەرفرازی دنیا و قیامەت



هیوادارم ئەم نامیلکەیە ببێتە هۆی هیدایەتدانی خوشکانمان

بۆ سەر ڕێگای ڕاست و باڵاپۆشی

یەك داوام لە تۆی خوێنەر هەیە کە ئەگەر سوودت لێی

وەرگرت دوعای خێرم بۆ بکە و بیگەیەنە بەیەکێك

پێویستی پێیە

خوای گەورە لێمی وەر بگرێ و دوور لە ڕیا و روپامایی

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لا اله الا انت

استغفرك واتوب اليك

یەکەم ڕۆژی نۆمینەی حاجیان ساڵی 1441کۆچی

22/7/2020







# ئەم ناميلكەيە ئاسانكارييە

## بۆ ئەو کچانەی دەيانەوێ ببنە باڵاپۆش و بگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە

"

بيانووەكانی باڵاپۆشی كردن باسكراوە

بە بەڵگەی ئەقڵی و نەقڵی وەڵام دراوەتەوە

بەشێوازێكی جوان و سەردەميانە نەخشێنراوە

تا لەخوێندنەوەی چێژێكی ڕۆحی و فيكری وەربگری

"

